@زنجیره کتێبی پێنجەمی KIC O (5)

# درووستکردنی سایت

# FRONT PAGE 2002

## هەنگاوێکە بۆ دروستکردنی

## سایت بەئاسانی

نووسینی: **سەرکەوت پێنجوێنی**

کوردستان –سلێمانی
2004

**ناوی کتێب:** دروستکردنی سایت
**ناوی نووسەر:** سەرکەوت پێنجوێنی
**زنجیره کتێبی ناوەندی ئینتەرنێتی کوردستان**5
**شوێن :** کوردستان – سلێمانی
**بابەت:** ئینتەرنێت
**دیزاین:** سەرکەوت
**چاپخانە:**گەنج
**دیزاینی بەرگ:** ئەندازیار سامان حەمەسالح
**چاپی بەرگ:**چاپخانەی تیشك
**تیراژ:** 2000 هەزار دانە
**چاپی:** یەکەم
**ژمارەی سپاردن لەوەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی کوردستان** (    )

# لەناوسیدی کتێبی

# دروستکردنی سایت

@ بەرنامەی XARA WEBSTYLE

@ بەرنامەی PDF CREATER

@بەرنامەی REFLET

@ چەندین بەرنامەی تری تایبەت بەدروستکردنی سایت

@ کۆدی JAVA و HTML

@ قاڵبی ئامادە بۆسایت

@ دووگمەی ئامادە بۆ سایت

@ چەندین وێنەی دیجیتاڵی بۆسایت

# لەم کتێبەدا

start

دروستکردنی سایت کارێکی زۆرگران نییە ,بەڵام سەلیقەو شارەزایی هونەری زۆری دەوێت ,زۆربەرنامە هەیە بۆدروستکردنی سایت ,بەڵام زۆربەیان پاڵپشتی فۆنتی کوردی ناکەن ,لەوانە بەرنامەی MACRO MEDIA DREAM WEAVER ,کەتابڵێت بەرنامەیەکی پرۆڤیشناڵە ,بەڵام دروستکردنی سایتی کوردی پێی کارێکی قورسە ,بۆیە ئێمەی کورد سوودی زۆر لەبەرنامەی FRONT PAGE دەبینین , کەبەهۆی WIZARD ئەوەی دەمانەوێت بەئاسانی دیزاینی دەکەین ..ئەو سایتانەی بەهۆی PAGE TEMPLETE دروست دەکرێن سایتی تەقلیدین و باویان نەماوە ,گرنگ ئەوەیە خۆت قاڵبێکی تایبەت بەخۆت دروست بکەیت و لینك و بەشەکانی تری تیا دابنێیت , لەم کتێبەدا تاتوانیومە بەوردی و ئاسانی باسم لەدروستکردنی سایت و زۆرلایەنی گرنگی کردووە ,کەبەدڵنیاییەوە پێتان دەڵێم تەنها بەهۆی ئەم کتێبەوە بەتەواوەتی فێری دروستکردنی سایت دەبن ,گوێی بەقسەی هەندێك کەس مەدەن ,کەدەڵێن دروستکردنی سایت کارێکی قورسە ,بە پێچەوانەوە ئەگەر ئارەزووت لێیی بێت لەئیمەیڵ دروستکرن ئاسانترە ..بەوهیوایەی بەهۆی ئەم کتێبەوە هەمووتان ببنە خاوەن سایتی تایبەتی خۆتان و لەئایندەدا بابەتی گرنگ و بەسوودترتان دەخەینە بەردەست .

سەرکەوت پێنجوێنی



## بەشی یەکەم

چۆنێتی درووستکردنی سایت بەئاسانی لەرێگەی دوونموونەی ئاسانەوە

## چۆنیەتی دروستکردنی سایت بەئاسانی

بەرنامەی فرۆنت پەیج 2002 یەکێکە لەبەرنامە ئاسان و کارەکییەکان بۆدروستکردنی سایت بەئاسانی , ئەمەش لەبەرئەوەی ە دووەمیشیان WORDیەکەم بەرنامەکە هاوشێوەی بەرنامەی لەبەرئەوەی بەرنامەی فرۆنت پەیج شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵیدا ئاسانەو بەسانایی ئەنجام دەدات بەدەستەوە, هەروەها بەرنامەیەکی دەوڵەمەندەو دەتوانیت بەهۆیەوە چەندین جوانکاری وئیفێکت ئیزافەبکەیتە ناوماڵپەڕەکەت , خاڵێکی گرنگی تر ئەوەیە بەرنامەکە توانای قبوڵکردنی فایلاتی تری هەیە و دەتوانیت لەبەرنامەی تری وەك فلاش و فۆتۆشۆپ و کۆڕاڵ و زۆربەرنامەی تر جوانکاری و ئیفێکتی بۆدانێیت ...

لێرەدا دوونموونەی دروستکردنی ماڵپەڕبەئاسانی باسدەکەم , ئەگەر بەوردی سەرنجیان بدەن و تاقیان بکەنەوە ئەوا ئێوەش زۆر بەئاسانی وەك چۆن ئیمەیڵ دروستدەکەن ئاواش سایتی تایبەت بۆخۆتان بنیات دەنێین . لەم کتێبەدا باس لەدروستکردنی سایتی کەسی یان تایبەت بەکۆمپانیاو رۆژنامە و گۆڤارەکان و دامووەزگاو رێکخراوەکان و بازرگانی و زۆری تر دەکەین . لەگەڵما بن و ئیتر سایت بۆخۆتان دروست بکەن .



**نموونەی یەکەم**

1- سەرەتا بەرنامەی Front page بکەرەوە و بچۆ لەرێگەی new پەیجێکی تازە بکەرەوە .واتە کلیك لەنیشانەی لاپەڕە بەتاڵەکە بکە, یان هەمان کردار لەناو file >page or web > بکە ئینجا لەولیستەی لای دەستەراست واتە تاسك پێن دروست دەبێت بچۆ page template کلیك بکە لەوێشدا Normal page کلیك بکە بۆکردنەوەی پەیجێکی تازە .

تێبینی : کرداری یەکەم ئاسانترەو مەچۆ بۆهی دووەم تەنها لەوکاتانەدا نەبێت , کەدەتەوێت بەهۆی قاڵبە ئامادەکراوەکان سایت بۆخۆت دروست بکەیت..



2- ئينجا بچۆ بۆ Format > Theme لەوكاتەدا بۆكسێك دەكرێتەوە ، كەلەناويدا باكگراوندی جۆراوجۆر هەيە تۆ يەكێكيان بەئارەزووی خۆت هەڵبژێرە و كليك لەسەر ok بكە.




*يەكێك لەم شێوانە دياری بكە :






ئەمە ئەوشوێنەيە سايتی تيا دروست دەكەيت




– ئينجا يەكسەر بچۆرە كليك لەسەر نيشانەی خەزن كردن بكەواتە save بۆ ئەوەی ئەوكردارانەی كردووتە خەزنيان بكەيت, كەئەمەنيشانەكەيەتی :

– پێويستە لەكاتی خەزنكردندا ئەم تێبينيانە بەگرنگ وەربگريت :

هەر,كە بۆكسی SAVE: كرايەوە, ئەوائەمانە جێبەجێ بكە




– لەناو لیستی my web خەزنی بکە .

– فۆلدەرێك folder یك دروست بکە بەناوی خۆت .لەناو ئەوفۆلدەرەدا

هەموو فایلەکان و وێنەکانت دابنێ و ماڵپەڕی سەرەکە سایتەکەت دەبێت بەناوی index... وە خەزن بکەیت

– لەگەڵ هەرکردارێکدا کلیك لەسەر خەزن بکە ...






3 –ئیستا کاتی ئەوەیە دووگمەو بانەرو بەشەگرنگەکانی سایتەکەمان و ئیفێکت و زۆر خزمەتگوزاری بۆسایتەکەمان دابنێین , کەدانانیان زۆر ئاسانە, لەگەڵما بن و بەوردی سەرنجی هەنگاوەکان بدەن:

سەرەتا لەسەرەوەی پەڕەکە ناویان ناونیشانی سایتەکەمان دەنووسین بۆنموونە سایتەکەمان سایتێکی گشتییە :

**سایتی ناوەندی ئینتەرنێتی کوردستان**

Kurdistan internet center




–یان دەتوانیت لەرێگەی بەرنامەی xara webstyle, کەبەرنامەکەی لەناوسیدی ئەم کتێبەدا هەیە و دەتوانن دایبەزێنن , بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە بانەرێك دروست بکە .

## چۆن بەهۆی بەرنامەی webstyle بانەر دروست دەکەیت

1- بەرنامەی xara webstyle بکەرەوە لەوێدا کلیك لەسەر Banner Ads بکە :




2- پاش ئەوە کۆمەڵێك شێوە دەبینیت کلیکی یەکێکیان بکە:






3ئینجا دەچین کلیك لەسەر text دەکەین لەلای دەستەچەپەوە,بۆ ئەوەی ناونیشانی سایتەکەمان لەناو بانەرەکەدا , کەهەڵمان بژاردووە بنووسین :




4- ئینجا دەچینەسەرەوە کلیکی لای راست لەسەر بانەرە دروستکراوەکە دەکەین و copy file to clipboard و هەڵدەبژێرین, بۆئەوەی لەناو ئەو پەیجەدا دایبنێین, کەلەناوبەرنامەی فرۆنت پەیج دروستمان کردووە .



4–دواجار لەوشوێنەی دەمانەوێت paste دەکەین و خۆی

یەکسەر شوێنی خۆی دەگرێت .




– دەتوانیت ئەو بانەرە بەئارەزووی خۆت گەورەو بچووک بکەیت

,ئەویش بەوەی یەك کلیکی لەسەر بکەو دراگی بکە بەملاولادا...

– دواجار کلیکی save بکە.

–ئێستا باس لەدانانی چەند خزمەتگوزاری و بەشێکی گرنگ بۆناو سایتەکەت دەکەین , کەلەناو بەرنامەی front page2002 دایە ...بەوردی ئەم هەنگاوانە بەکاربهێنە, چونکە زۆر ئاسانن :

*سەرەتا با نوسینێك دابنێین کەلەم سەری شاشەکەوە بۆئەوسەری شاشەکە بڕوات وەکو وئاگاداری یان پێناسەیەك بۆناساندنی سایتەکەت یان هەواڵێك یان هەرشتێکی تر بەسەردانکەرانی سایتەکەت رابگەیەنێت , بۆئەم مەبەستە بچۆ بۆ:

**inser> webcomponent**



لەناو شریتی ئامرازەکان ئەم نیشانەیەی هەیە



ت کردەوە کلیکی ئێرە بکە insertیان کە,




*بۆکسێك دەکرێتەوە بۆت تۆ لەو بۆکسەدا یەکسەر بچۆرەسەر خانەی دەستە راست و هەڵبژاردنی Marqueeسەلێکت بکە و ئینجاکلیکی FINISHبکە :



*ئینجا بۆکسێکی تر دەکرێتەوە بەمجۆرە :

لێرە ئاراستەی ڕۆیشتنی نوسینەکەت دیاری بکە

لێرە دەقی نوسینەکەت بنووسە

*لەبەشی speed و بەهۆی delay دەست بکە بەدیاریکردنی زەمەنی وەستانی نووسینەکە لەنێوان هەموو هەنگاوێك لەهەنگاوەکانی جوڵە,کە بەمیلی چرکە پێوانە دەکرێت.لەرێی AMOUNT دەست بکە بەدیاریکردنی میقداری ئەو ماوەیەی هەموو هەنگاوێك لەهەنگاوەکان دەیجوڵێنێت , کەبە یەکەی پیکسڵ پێوانە دەکرێت.

*لەبەشی Behavior دەست بکە بە بەدیاریکردنی جوڵەی ناونیشانەکە , ئەگەر هاتوو scroll ت دیاری کرد ئەوا یەکسەر نووسینەکە لەلایەکی شاشەکەوە بۆ لایەکی تری دەڕوات و لەکۆتایی شاشەکە نوسینەکە تەواو دەبێت .ئەگەر هاتوو



Slide ت هەڵبژارد ئەوا نووسینەکە لەتەنیشت شاشەکەوەبۆ لایەکی تری شاشەکە, بەڵام دەقەکە لەکۆتایی شاشەکە تەواو دەبێت ئەگەر هاتوو Alternate ت هەڵبژارد ئەوا نووسنەکە لەلایەکی شاشەکەوە بۆ لایەکی تری دەڕوات , بەڵام ,کەدەگاتە کۆتایی جارێکی تر نووسینەکە دێتەوە بۆ لایەکی تر .

*لەبەشی size دەست بکە بەدیاریکردنی پانی width و بەرزی height دەقەکە , بەرنامەکە بەشێوەیەکی خۆیی ئەمە رێکدەخات.

*لەبەشی repeat دەست بکە بەدیاریکردنی ئەوەی ,کەچەند جار ئەو جوڵەیە دووبارە بێتەوە , ئەگەر هاتوو continuously ت دیاریکرد ئەوا بەبەردەوامی ئەو جوڵەیە دووبارە دەبێتەوە .

* دواجار لەلیستی background color دەست بکە بەدیاریکردنی باکگراوندی نووسینەکە. ئینجا ok بکە

*بۆئەوەی وەکو تاقی کردنەوە بزانیت لەئینتەرنێتدا چۆن دەردەکەوێت کلیکی PREVIEW بکە لەخوار پەیجەکەوە :

–ئینجا کاتی ئەوە هاتووە لینکەکانت بنووسیت, لێرەدا دەتوانیت لینکەکانت بەنوسین بنووسیت و دەشتوانیت دووگمەی جوان و رازاوەیان بۆدروست بکەیت ,کەبەوردی باسی دەکەین:

–بەرلەوەی باسی چۆنیەتی نوسین و رێکخستنی لینك و رەنگکردن بکەین پێویستەلەوئامرازانە شارەزابین کەلەوبوارەدا بەکاریان دێنین ,بەوردی فەرمانی هەریەك لەمانە بزانە:









*ئینجا دەچین ئەولینکانەی دەمانەوێت لەلای دەستە راست یان چەپی پەیجەکەوە بەرێز دەیاننوسین,بۆنموونە سایتەکەمان لەم لینکانە پێك دێت:

ماڵەوە

هەواڵ

چالاکی

زانیاری

وێنە

بابەت

بەرنامە

لینك

پەیوەندی

–سەیری ئەم نموونەیە بکە لەناوپەیجەکەدا:




– دەتوانین لەناو بەرنامەی فرۆنت پەیجدا دووگمە دروست بکەین ,بەلاَم شێوەیەکی تەقلیدی هەیەو وەکو پێویست جوان نییەوئەگەر ویستت لەناو بەرنامەی فرۆنت پەیج دووگمە بۆسایتەکەت دابنێیت بچۆرەسەر: INSERT>WEBCOMPONENT

*بەلاَم وەکو ئاماژەم پێدا لەوێدووگمەی جوانت دەست ناکەوێت لەجیاتی ئەوە لەناو ئەم بەرنامانە دووگمەکانت دروست بکە :



Adobe photoshop- Coreldraw- FLASH MX- XARA WEBSTYLE-3D WEB BUTTON . هەروەها زۆربەرنامەی تر ...بەلاَم ئاگاداربە هەندێك بەرنامە پاڵپشتی فۆنتی کوردی ناکات .

*ئێستا دەچینە ناو بەرنامەی فۆتۆشۆپ دووگمەکانمان دروست دەکەین:

# دروستکردنی دووگمەی جوان لەناو بەرنامەی PHOTO SHOP

1– سەرەتا بەرنامەی فۆتۆشۆپ بکەرەوە :



2– لەوێدا کلیك لەسەر File> New بکە بۆکردنەوەی پەڕەیەکی نوێ




3– قەبارەی پەڕەتازەکە بەسانتیمەتر دیاری بکە :






5لەناو ئەوپەڕە تازەیەدا کلیك لەئامرازی Rectangle tool بکە لەشریتەکانی دەستە چەپ:




6–ئینجا بەهۆی بەکارهێنانی ئەوئامرازەوەچواچێوەیەك دروست بکەو پاشان بەهۆی رەمزی نوسین لەفۆتۆشۆپ ,کەئەمەنیشانەکەیەتی لەناو ئەوچوارچێوەیەدا ناوی لینکەکەت بنووسە : بۆنموونە بنووسە (ماڵەوە )ئاگاداربە کاتێکتۆ باکگراوندێکت بۆ دووگمەکە هەڵبژاردووە بۆنموونە رەنگەکەی سوورە دەبێت پێش ئەوەی شت لەسەر ئەوباکگراوندەبنووسیت رەنگی نوسینەکەت بگۆڕیت :




7-ئینجا بۆپێدانی جوانکاری و گلۆ کردن و ئیبرازکردنی نوسینی ناو دووگمەکە دەچین ئەو نوسینە سەلێکت دەکەین و ئەم فەرمانە دەکەینەوە:

Layer>Layer style> Blending Option






8-پاش کردنەوەی ئەوبۆکسە گەورەیە بەئارەزووی خۆمان جوانکاری بۆ نوسینەکەمان دادەنێین ,پێویستە لەکاتی هەڵبژاردنی ئەوجوانکاریانەدا ئەودووگمەیە لەبەرچاومان بێت تاوەکو ئەوجوانکاریانەی دایدەنێین ببینین:




9- سەیرێکی دووگمەکە بکە چەند گۆڕاوەو ئیبرازبووە :



10- دواجار بچۆبۆ: FILE>SAVE ASبۆئەوەی بەشێوەی JPEGدووگمەکەت خەزن بکەیت وپاشان لەناوبەرنامەی فرۆنت پەیج وەکو وێنە دایبنێ.




* تێبینی : لەبەشی 7 باسمان لەچۆنییەتی دروستکردنی دووگمە بەبەرنامەی XARA WEBSTYLE کردووە ...

– ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لینك بۆ نوسین وبابەتەکانت دروست بکەیت:



# چۆن لینک دروست دەکەیت ؟

دروستکردنی لینك واتە لکێنەر بۆدووگمەی سایتەکەمان زۆرئاسانە, ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکەو بەئاسانی لینكLINK دروست بکە:

1– ئەوبەشەی دەتەوێت لینکی بکەیت ئیتر لینکەکەت نوسین بێت یان دووگمە سەلێکت بکەو کلیکی راستی لەسەر بکە یان کلیك لەسەر ئەم نیشانەیە بکە کەنیشانەی HYPERLINKە:






2– هەرکەکلیکت لەسەر HYPERLINK کرد, یەکسەر ئەم بۆکسەت بۆدەردەکەوێت:




3– لەناوبۆكسەكەدا تێبینی دەكەیت لەخانەی سەرەوە ناوی ئەوبەشە نوسراوە ,كەلینكی دەكەیت بۆیە یەكسەر بچۆلەخانەی Look in , ئەوفۆڵدەرەی هەموو فایلەكانت تیاداناوەبكەرەوەو ئینجا ئەوفایلەی دەتەوێت لەگەڵ لینكی هەواڵ دا دایبنێیت هەڵبژێرە واتە یەك كلیكی لەسەر بكە,دەبینیت لەلیستی Address ناوی فایلەكە دەنوسریت , دواجار كلیكی ok بكە .

4– ئێستا ئەوفایلەی ناوی news مبۆتەبەشێك لەلینكی هەواڵ و بەكلیك كردن لەسەری دەكرێتەوە ,بۆئەوەی دڵنیابین ,كەلینكەكەت دروست بووە یان نا بچۆ كلیكی PREIVIEW بكە بۆبینینی و پاشان كلیك لەسەر لینكی هەواڵ بكە یەكسەر ئەوەی بۆت داناوەو لینكت كردووە دەكرێتەوە پاشان بچۆرەوەسەر بەشی Normal .بەمجۆرە هەمووبەشەكانی ,كەدەتەوێت بەهەمان شێوە لینك بكە , بەڵام ئاگاداربە بۆلینك كردنی ئیمەیڵ ئەم هەڵبژاردنە لەبۆكسەكە دیاری بكە :

E.mail Address

–پاش تەواوبوون لەلینك كردنی بەشەكانت ئینجا كاتی ئەوە هاتووە سایتەكەت بخەیتە ناوئینتەرنێتەوە واتەئەوشوێنەی بەشداریت تیاكردووە , هەروەها دەشتوانیت چەند شتێكی گرنگ بۆناوماڵپەڕەكەت ئیزافە بكەیت وەكو ئامرازی سێرچ –دەفتەری میوانان – وێنە –ئیفێك واتە كاریگەری جوان – مەلەفی فلاشی –



كۆد , ولەم كتێبەدا بەوردی باسیان دەكەین .ئەمە دوانموونەی سایتەكەمانە ,كەدروستمان كردووە :



## نموونەی دووەم

لەم نموونەیەدا سایتێك دروست دەكەین  كەشێوەیەكی سایتی ئەوروپایی هەیە.

1– سەرەتا بەرنامەی front page 2002 بكەرەوە پەڕەیەكی نوێ هەڵبژێرە.




2– ئینجا بەناوی index لەناو فوڵدەرێكدا خەزنی بكە .






– یەكسەر ,كەفوڵدەرەكە دروستبوو كلیكی بكەو فایلی سەرەكی سایتەكەت كەناوی index ە سەیڤ بكە تیایدا ...

3– ئینجابۆدانانی باكگراوند بچۆرەسەر format>background یان لەناو theme باكگراوند هەڵبژێرە وەكو لەنموونەی یەكەمدا باسمان كردووە , لێرەدا دەچینەسەر هەڵبژاردنی background :




بۆ گۆڕینی رەنگی نوسین

بۆ گۆڕینی رەنگی لینك

–ئینجا ok دەكەین وئەم نموونەیەمان بۆدەردەكەوێت :




4–سەرەتا بچۆ لەسەرەوە كاریگەریەكی DYNAMIC HTML دابنێ بەمجۆرە:

ا–سەرەتا بچۆ

بۆFORMAT>DYNAMICHTMLEFFECTS






ب– ئینجا یەكسەر ئەم شێوە لاكێشەییەت بۆدەردەكەوێت :




ج– یەكێك لەوئیفێكتانە هەڵبژێرە ,بۆنموونە MOUSE OVER دیاری دەكەین یەكسەر لیستێكی ترت بۆدەكرێتەوەبەناوی لیستی Apply بچۆ لەوێدا Formatting هەڵبژێرە یەكسەر لیستێكی ترت لەلایەوە بۆدەكرێتەوە:




د– لەلیستی choose setting جۆری بۆردەر واتە چوارچێوەو جۆری فۆنتی ئیفێكتەكە هەڵبژێرە:



ه- لەگەڵ كلیك لەسەر هەڵبژاردنی choose border كرد ئەوا ئەم بۆكسە دێت لەرێگەیەوە رەنگی چوارچێوەو شوێن و بەشەكانی ,كەلەچەند لاوە دەربكەوێت دیاری بكە ..




و- لەگەڵ كلیك كردن لەهەڵبژاردنی choose font ئەم لیستە دێت تیایدا جۆری فۆنت و قەبارەی فۆنت و هەروەها زۆر شێوەی دەركەوتنی نوسینەكەی ,كەلەناو بۆردەرەكەدا دایدەنێین ئامادەكراوە.






ز- ئینجا لەناو اكێشەكەدا ئەوەی دەمانەوێت دەینووسین : بۆنموونە دەنووسین:

**سایتی دانا رەشید**

پاش دیاریكردنی ئەوبەشانە پەیجەكەمان ئاوها دەردەكەوێت و ئیفێكتی DHTML ی بۆزیاد دەبێت ,كەرەونەق و جوانی دەداتە پەیجەكەمان.




- لەكاتی دانانی لەئینتەرنێتدا بەمجۆرە دەكرێتەوە, هەر ,كەبەماوسەكە چوویتە سەر ئەونووسینە لاكێشەیەك بەئیفێكتێكی جوان دروست دەبێت و,كەلاچوویت لاكێشەكە نامێنێت , ئێستا ناوی دانارەشید بەفۆنتی عەرەبی دەبینیت , بەڵام بەماوسەكە بچیتە سەری دەبێتە فۆنتی ALI .K.SAMIK ی كوردی .



– ئیستاتامرازی گەڕان SEAERCH بۆ سایتەکەمان دادەنێین, ئەم تایبەتمەندییە لەناوبەرنامەی فرۆنت پەیجی 2002 دا هەیەو کەسێتییەکی بەرز دەدات بەسایتەکەت, دەتوانیت سێرچەکە بەناوی خۆت یان شوێن یان ئەوەی دڵت دەیخوازێت دابنێیت.

# لەناو *SEARCH* چۆن سایتەکەتدا دادەنێیت؟

1– سەرەتا بچۆرە سەر insert>webcomponent

2– لەوێدا بچۆ رۆ لەلیستی دەستەچەپ web search هەڵبژێرە:




–پاش دیاریکردنی WEB SEARCH کلیك لەسەرFINISHبکە.



– ئەم بۆکسە دەکرێتەوە تۆ ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکە:




ئەو وشەیە بنووسە کەسەردانکەری سایتەکەت لەکاتی نوسینی وشەیەکدا کلیکی لەسەر دەکات بۆسێرچ کردن

لەوێدا بنووسە گەڕانی تر واتە ئەگەر لەوەی پێشوودا ئەنجامت دەست نەکەوت لەمەدا شت بنووسە ئۆتۆماتیکی نوسینەکەی سەرەوە لادەبات بەکورتنییەکەی واتە سێرچکردنێکی تازە....

4– لەرێگەی هەڵبژاردنی دووەم لەبۆکسەکەدا چەند تایبەتمەندییەکی تر بۆئامرازی سێرچ هەیە :




– دواجار OK بکە.

**@بەمجۆرە دەبیتە خاوەنی سێرچی تایبەت بەخۆت: سەیری پەیجەکە بکە:**






ئیستا کاتی ئەوە هاتووە دووگمەی ماڵپەڕەکەمان دروست بکەین :

– بۆئەم مەبەستە دەچین بۆناو بەرنامەی XARA WEBSTYLE و لەوێوە دووگمەی جوان دروست دەکەین :

1– سەرەتا هەربەرنامەکە کرایەوە کلیك لەبەشی Button بکە .



3- لەو هەموو دووگمە جوانەی لەبەردەستماندایە یەکێکیان هەڵدەبژێرین ، ئینجادەچین کلیك لەسەر هەڵبژاردنی textدەکەین ,کەلەلای دەستەچەپی بەرنامەکەیە بۆئەوەی ناوێك بۆلینکەکەمان بنووسین:




4- بەمجۆرە ناوی لینکەکەمان دەنووسین :






5-پاشان دەچین کلیکی لای راست لەسەر ئەو دووگمەیە دەکەین و هەڵبژاردنی Copy file name to clipboard کلیك دەکەین.




-پاشان دەچینەوە ناو ماڵپەڕەکەمان لەبەرنامەی فرۆنت پەیج و ئەو دووگمەیە paste دەکەین, نیشانەی ماوسەکەمان لەکوێی دانابێت ئەو دووگمەیە لەوێی دادەنێیت. سەرنج بدە:




تێبینی : بۆدروستکردنی دووگمەی تر بەهەمان شێوە بچۆرەوە ناوبەرنامەی xara webstyle و دووگمەکانی ترت بەهەمان هەنگاوەکانی کەباسمان کرد دروست بکە.

تێبینی گرنگ : لەگەڵ دانانی هەردووگمەیەکدا بۆکسێك دێت بۆسەیڤ کردن OK بکە.

سەیری ماڵپەڕی ڕۆژنامەنووس دانا ڕەشید بکەن :




–ئیستا ئەو دووگمانە لینك LINK دەکەین :

چۆن ئەو دووگمانەی سایتی دانارەشیدی ڕۆژنامەنووس لینك دەکرێت؟

1– یەکەمجاربچۆرەسەر لینکەکەو کلیکی لای ڕاست بکەو hyper link هەڵبژێرە بەمجۆرە:






2– ئینجا لەوبۆکسەی دەکرێتەوە بچۆ لەناو ئەوفوڵدەرەی هەموو فایلەکانی سایتەکەت تیاداناوە بۆنموونە لێرەدا ناوی kurd بیکەرەوەو فایلی nawdar لەگەڵ ئەودووگمەیەدا لینك بکە بەمشێوەیە:




@ فوڵدەری تایبەت بەم ماڵپەڕە کەناوی kurd لەناو بەشی mywebs بکەرەوە کلیکێک لەسەر ئەو فایلەبکە،کەدەتەوێت لەگەڵ دووگمەی ناودارnawdar بیبێت بەلینک،سەرنج بدە لەخانەی Address ناوی فایلەکە واتە nawdar دەرکەوتووە،ئەوە نیشانەی ئەوەیە ،کەئەوفایلە لینک بووە ئینجا کلیکی ok بکە....

تێبینی : ئەگەر لەدوای ئەوکرداری لینك كردنە بچیتەسەر preiview وكلیكی لینكی nawdar بکەیت یەكسەری چی لەناو ئەودووگمەدانرابێت دەكرێتەوە.

– بۆئەوەی بەشەكانی تری سایتەكەمان تەواوبكەین بچۆرەوەسەر بەشی Normal لەشوێنی پیشاندان...

## –دانانی ژمێرەر Hit Counter :

ئەم ئامرازە بەكاردێت بۆ دروستكردنی ژمێرەر counter بۆ ئەوەی لەرێگەیەوە ژمارەی ئەوكەسانە بزانیت , كەسەردانی سایتەكەیان كردوویت , ئەمە وەكو عەدادێك وایە كێ سەردانی سایتەكەت بكات ژمارەی ئەو سەردانكارە ئیزافە دەكات.لەناو بەرنامەی فرۆنت پەیجدا دەتوانیت شێوەی ژمارەو بەهای سەرەتایی ژمێرەرەكەو ژمارەی خانەكانی ژمارەكان دیاری بكەیت , بەمجۆرە ژمێرەر دروست دەكەیت:

1– بەماوسەكە كلیك لەوشوێنە بكە ,كەدەتەوێت ژمێرەرەكەی لێی دابنێیت .






2– لەلیستی insert بچۆ web component دیاری بكە , بۆئەوەی بۆكسی insert web component دەربكەوێت .




3– Hit counter لەلای چەپ هەڵبژێرە,ئینجا لەلای راست شێوەی ئەو ژمارانەهەڵبژێرە , كەدەتەوێت بۆ ژمێرەرەی سایتەكەتی دابنێیت.
555

4– كلیك لەسەر دووگمەی FINISH بكە تاوەكو بۆكسی Hit counter دەربكەوێت.

5– دەست بكە بەهەڵبژاردنی بۆكسی Reset counter to , پاشان دەست بكە بەدیاریكردنی بەهای سەرەتایی ژمێرەرەكە.

6– دەست بكە بەهەڵبژاردنی بۆكسی Fixed number of digits , ئینجا دەست بكە بەدیاریكردنی ژمارەی خانەی ژمارەكانی عەداد واتە ژمێرەرەكە. دواجار كلیكی ئۆكەی بكە.


Hit Counter Properties
Counter Style
0123456789
0 1 2 3 4 5 6 7 8 9
0123456789
0123456789
0123456789
Custom Picture
custom.gif
Reset counter to
0
Fixed number of digits
5
OK
Cancel




بەشی دووەم
چۆنیەتی بەشداریکردن لەسایتێکدا تا پەیجی
سایتەکەمان دابنێین و چۆنییەتی دانانی پەیجەکەمان
لەئینتەرنێت

پاش ئەوەی ماڵپەڕی سایتەکەت دروستکرد ئێستا پێویستت بەوەیە شوێنێك بۆ سایتەکەت بگریت تاوەکو لەئینتەرنێتدا داغڵی بکەیت و لەسەرانسەری جیهاندا خەڵکی وەریبگرن، چونکە وەکو دەزانین ئینتەرنێت جوگرافییای نییە و ئەو سایتەی تۆ دروستی دەکەیت و لەئینتەرنێتدا دایدەنێیت لەهەموو لایەکی دونیادا دەکرێتەوە .دووجۆر بەشداریکردن و ناردنی سایت هەیە بۆ ئینتەرنێت یەکەمیان ئەوەیە , کەدۆمەینێك بۆخۆت لەنێتدا بکڕیت وەکو .COM ./NET.,کەئەمەش بۆ ئێمەی کورد ,کە فیزا کارتمان نییە زۆری تێدەچێت و گرانە , جۆری دووەمیان بەشداریکردنە لەشوێنێکی بەخۆڕایی تاوەکو ماڵپەڕی سایتەکەتی تیاداغڵ بکەیتو لەوێوە زوو زوو دەستکاری و گۆڕانکاریشی بەسەردا بهێنیت ... باشترین شوێن بۆ دانانی ماڵپەڕەکەت سایتی فری سێرڤەرە freeserver کە بۆشاییەکی زۆرت دەداتێو دەتوانیت زۆر شت لەناو ماڵپەڕەکەت دابنێیت . بەشداریکردن لەناو فری سێرڤەر یەکجار ئاسانە ئەم هەنگاوانە بگرەبەر تۆش دەبیتە خاوەن سایت .

1- سەرەتا ئەم سایتە بکەرەوە : www.freeserver.com بکەرەوە.






2- کلیك لەسەر ئەو هەڵبژاردنە بکە کەنووسراوە learnmore FREE وەکو لە وێنەکەدا دیارە:




3- پاشان 3 هەڵبژاردن دێتە بەردەمت تۆ بچۆرە سەر هەڵبژاردنی 2 کە بەخۆڕایی و بێبەرامبەرە: وات ئەوەی نوسراوە Iwant to use Afree sub –domain لەناو خانەکەدا ناونیشانێك بۆ سایتەکەت دابنێی بۆنموونە www.sarkawtt.4mg.com ئینجا دواری ئەوە لەلیستی تەنیشتیەوە بەئارەزووی خۆت یەکێك لەوکورتکراوانە دیاری بکە وەکو 4tیان 8k .....



Next >>

پاش دیاریکردنی ناونیشانەکەت کلیك لەسەر nextبکە.

4- لەو پەڕەیەی کەدەکرێتەوە بۆت وەرە لەخوارەوە کەنووسراوە FREE HOSTING OPTION کلیك لەسەر Sing-Up بکە .

Free Hosting Option

FREE

I am just starting out and want to try a free Web site. I agree to display FreeServers ads on my pages, present occasional pop-up ads and receive promotional emails. I can choose to upgrade my site later.

Sign-Up

5- لە پەڕەکەی تردا وەرە خوارەوەو کلیك لەسەر NO THANKS بکە..

No Thanks

I want to try your free hosting package.
(I really like banners and popups... they make me happy.)

<< Back  No Thanks

6- فۆرمێك دێتە بەردەمت بەمجۆرە پڕی بکەرەوە :

*First Name: sarkawt
*E-mail Address: sarkawtt@yahoo.com
Note: This e-mail address will be used to send
Verify E-mail: sarkawtt@yahoo.com
Please type your e-mail address again to verif
Date of Birth: April , 19 75 (Month,
Click here to view our Children's Privacy Polic
*Gender M F
Country: Iraq
Zip/Postal Code: 964

* ناوی خۆت بنووسە
*ئیمەیڵەکەت بنووسە
* مانگ و ساڵی لەدایکبون دیاری بکە
*رەگەزەکەت دیاری بکە
iraq*وڵاتەکەت دیاری بکە
*کۆدی عێراق بنووسە کەیەکسانە بە964
*

Choose a Password

You will use your site name and this password to login to your site. Your password must contain **at least 6 characters**. A combination of upper and lowercase letters and numbers is recommended for greatest security.

*Password: ••••••••
*Verify Password: ••••••••

Password پاسۆوردێك بنووسە لەخانەکەی تر هەمان پاسۆرد بنووسەرەوە

Terms of Service

* I have read the FreeServers Terms of Service and I agree to those terms.
*Please type the 4-character security code PPPA into this box: pppa
(This is to prevent automated signups.) **Please enter the 4 digit security code**

Next >>

ئەم ژمارەیە لەناوخانەکەدا وەکو خۆی بنووسەرەوە

بکەNEXTدواجار کلیکی

2- ئێستا تۆ بوویتە ئەندام و بۆ ئەوەی بچیتە ناو ئەوشوێنەی کە ماڵپەڕەکەتی لێی دادەنێیت بچۆ کلیك لەسەر LOEN TO SITE .

Managing Your Web Site

You can login to your site's control panel by going to sarkawtt.4mg.com/cgi-bin/login and using the username and password below.

Username: sarkawtt.4mg.com
Password:

ئینجا کلیکی ئێرە بکە

Print  Login to site >>

Half the Cost of AOL**

NetZero Platinum Features
- Unlimited Internet Access
- Reliable Connections
- 10 MB of E-mail Storage
- Instant Messaging Compatibility
- 2-minute Download

Available for Windows, Mac OS and Lindows OS

* Additional phone and live tech support charges and usage restrictions may apply
** References to AOL pricing and savings amounts based on standard monthly rates as of 03/01/04. Prices are shown in US dollars.
††Netzero HiSpeed does not increase the transmission speed of files or attachments, including music or video.

Surf the web up to 5x faster††
through your existing phone jack!

Now Includes Pop-Up Blocker and all Platinum features Plus:
NetZero MegaMail

25 MB of Storage | 250 Safe Lists
250 Block Lists | Mail Attachments
50 Mail Assistants | Mail Forwarding

More about HiSpeed  More about MegaMail

ue into your member area to start setting up your site.

Next >>

کلیکی nextبکە

ئاسانترین  ڕێگە بۆ ناردنی ماڵپەڕەکەت بۆ ناو ئینتەرنێت و دەستکاریکردن و گۆڕینی لاپەڕەکانی هەر لەڕێگەی ئەو کۆمپانیایەوە دەبێت کە پێشووتربەشداریت تێداکرد , واتە دوای ئەوەی ماڵپەڕی سایتەکەت دروستکردوو لەناو شوێنێکی بەخۆڕایی وەکو سایتی freeserver بوویتە ئەندام ئێستا هەرلەڕێگەی سایتی freeserverەوە دەچیتە ناوئەو شوێنەی کەدەتوانیت کاری ناردنی ماڵپەڕەکەت بۆ ناوئینتەرنێت ئەنجام بدەیت و ناوبەناو بەپێی پێویستی پەیجە کۆنەکان لابەریت و پەیج و بابەتی تازە داغڵ بکەیت, بۆ ئەم مەبەستە ئەم خاڵانە جێبەجێ بکە :

1- سەرەتا ئەم سایتە بکەرەوە www.freeserver.com .




2- لەوپەنجەرەی دەکرێتەوە بچۆ ناونیشانی سایتەکەت ,کەپێشتر لەپڕکردنەوەی فۆرمەکەدا نوسیبووت لەگەڵ پاسۆردەکەت لەودووخانەیە داغڵ بکە دواتر کلیك لەسەر LOGIN بکەوسەیری وێنەکە بکە :

Login to your site
Site:
sarkawtt.4mq.com
Remember this site in my list of sites.
Password:
Remember the password for this site.
Login!

3- ئینجا یەکسەر دەچیتە شوێنی کارکردن وەکو لەموێنەیەدتا دیارە , تۆ بچۆ کلیك لەسەر Build My Site بکە




تێبینی: پێویستە بەرلەهەرشتێك ماڵپەڕی سایتەکەت لە سەر هاردی کۆمپیوتەرەکە دابنێیت و ئامادەی بکەیت بۆ ئاپلۆد کردن upload .

3- ئینجا لەو دەروازەیەی دێتە پێشەوە تۆ سەرەتا کلیك لەسەر upload بکە داوای ژمارەی ئەو فایلانەت لێیدەکات ,کەدەیهاویتە ناوسایتەکەتەوە ژمارەی فایلەکان دیاری بکە ئینجا و چاوەڕوان بە.









4- ئینجا لەرێگەی Browse ەوە ئەو فایلانەی ماڵپەڕەکەت بهێنە بۆنموونە فایلەکان لەناو هەر درایڤێکدا دانراوە بیانهێنە ئەمەش دوای ئەوەی کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Browse دەکەیت و فایلەکان دێنیت .




5- پاش کەمێك چاوەڕوانی دەبینیت فایلەکانت ئاپلۆد بوون و داغڵی ئینتەرنێت بوون ئێستا بۆ تاقیکردنەوەی ئەوەی ,کەدڵنیابیت ئایا سایتەکەت داغڵ بووە یان نا لەوکاتەدا ناونیشانی سایتەکەت لەپەیجێکی تازەی ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەردا تاقی بکەرەوە.




**@تێبینی زۆرگرنگ:** ئەگەر ویستت جارێکی تر ئەوپەیجەی پێشتر داغڵت کردووەو ئێستا لایبەریت و لەوجێگەی پەیجی تر داغڵ بکەیت, ئەوا دەچیت لەبەردەم ئەوپەیجەی پێشوو چوارگۆشەیەکی بچووك هەیە لەناو چوارگۆشەکە کلیکێك بکە ئینجا کلیك لەسەر دووگمەی Delete و پاشان پەیجەکەی تر ئاپلۆد بکە....

## تێبینی گرنگ بۆئەوانەی سایتەکەیان دەخەنە ناوئینتەرنێتەوە :

1- هەمووئەو فایل و وێنەو بابەتانەی ,کەهەتە لەناو فوڵدەرێکدا لەناو MY WEB دابنێو ناوێکی لێبنێ.

2- دەبێت ناوی فایلی سەرەکی سایتەکەت واتە HOME PAGE ەکەت بەناویINDEX لەناو ئەوفوڵدەرەی دروستتکردووە خەزن بکەیت.

3- کاتێك دەتەوێت فایل و وێنەکانت UPLOAD بکەیتە ناو سایتەکەت واتە لەناوسایتەکەت داغڵی بکەیت پێویستە چی فایلو وێنە لەناو فوڵدەرە سەرەکییەکەتدا هەیە دانە دانە لەرێگەی BROWSE ەوەداغڵی ناو ئینتەرنێتی بکەیت.



## بەرنامەی xara web style

بۆدروستکردنی دووگمەو چوارچێوەو باکگراوندو جوانکاری بۆ ماڵپەڕەکەت بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە بەشێوەیەکی ئاسان جوانترین دووگمەو چوارچێوەو باکگراوند بۆ ماڵپەڕەکەت دروست دەکەیت و ناوی خۆت یان لینکی سایتەکەتی دەخەیتە سەر , لێرەدا لایەنە گرنگەکانی بەرنامەکە دەخەینە روو:




دروستکردنی دووگمە: 1–بۆ ئەم مەبەستە لەکاتی کردنەوەی بەرنامەکە کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Buttons بکە .

2–کۆمەڵێك نموونەی دووگمەی جوان دێتەبەرچاوت یەکێکیان دەبڵ کلیك بکە




تاوەکو دەستکاری بکەیت , دوای ئەوەی دەبڵ کلیکت کرد نموونەکەت لەسەرەوە پیشان دەدات ئینجا بچۆ بۆسەر text لەلای دەستە چەپ و لەوێی کلیکی text بکە بۆ ئەوەی ناوی خۆت یان ناوی لینکەکانت لەناو ئەودووگمەیەدا ببینیت ....




پاش ئەوەی ناوەکەت نووسی بچۆ سەرەوە کلیکی لای راست لەسەر ئەو دووگمەیە بکە , کەدروستت کردووە ولەوێدا کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Copy bitmap to clipard بکە



* ئینجا بچۆرە سەر دیسك تۆپ paste بكە بۆدانانی ئەودووگمەیە .

@ دروستکردنی بانەر :

1- سەرەتا كلیك لەسەر Banner Ads و بەئارەزووی خۆت بانەر واتە چوارچێوەیەك دیاری بكە :




2- دوای هەڵبژاردنی بانەرەكە بچۆ كلیكی text بكە لەلای دەستە چەپ بۆنووسین لەناو بانەرەكە :




1- بۆ ئەوەی ئەو بانەرە سەیڤ بكەیت كلیكی لای راست لەسەر بانەرە دروستکراوەكە بكە و ئینجا copy file name to.... هەڵبژێرە بۆكۆپیكردن و پاشان لەسەر دیسك تۆپ پەیستی بكە paste .

بەمجۆرە كلیك لەسەر ئەوەی سەردیسك تۆپ بكە بۆكردنەوەی ...




بۆزانیاری زیاتر لەسەر ئەم بەرنامەیە پێویستە ئەمانە بزانیت :



# چۆن چەند دووگمەیەک بەیەک ریز بەڕێکی دادەنێیت؟

1– سەرەتا هەر,کەبەرنامەی xara web style کرایەوە بچۆ کلیك لەسەر هەڵبژاردنی NavBars بکە.




2– لەوشوێنەی دەکرێتەوە بچۆ بەئارەزووی خۆت یەکێك لەوشێوانە هەڵبژێرە ,کەدەتەوێت ببێت بەدووگمە بۆسایتەکەت :




3– ئینجا هەرلەوبۆکسەدا لەلای دەستەچەپ کلیك لەسەر هەڵبژاردنی text بکە بۆنوسینی لینکەکانت بەمجۆرە:




تێبینی :سەرنج بدەرە خانەی text ئەوەی لەسەر دووگمەکە نوسراوە لەوێدا ئەکتیڤ و حازرە بۆئەوەی گۆڕانکاری بەسەردا بهێنیت تۆبچۆ لەناو تێکستەکەدا یەکەیەکە ناوی ئەولینکانە بگۆڕە بۆنموونە home بکە بەmalpar ..لەبۆکسی Font جۆرە ئەوفۆنتە دیاری بکە ,کەدەتەوێت دووگمەکەتی پێی بنوسیت ....

لەرێگەی ئەمەوە قەبارەکەی دیاری بکە

4– ئینجا سەرنجی لینکەکە بدەپاش ئەوەی ناوی لینکی سایتەکەمان دیاری کرد:




**<u>تێبینی</u> :** بۆئەوەی یەکەبەیەکەی لینکەکان بگۆڕیت و ناوی تازەیان بۆدابنێیت پێویستە ئەولینکەی پێشوو سەلێکت بکەیت و بچیت لەناو خانەی یەکەم ناوە تازەکە بنووسیت ، ئەم حاڵەتە بۆئەوانەی تریش دووبارە بکەرەوە..

5-دواجار کلیکی لای راست لەسەر ئەو نموونەیە بکە ,کەدروستت کردووە و هەڵبژاردنی copy filename toclipboard کلیک بکەو

پاشان بچۆرە ناو بەرنامەی فرۆنت پەیج و لەوشوێنەی دەتەوێت paste بکەو رێکی بخە…






## <u>بەشی چوارەم</u>

## دانانی کۆد بۆساتەکەت

## چۆنیەتی دانانی کۆد code بۆ ماڵپەڕەکەت

بەهۆی دانانی کۆدەکانەوە جوانکاری سەیر بۆ ناو ماڵپەڕەکەت دادەنێیت , دانانی کۆد کارێکی ئاسانە , بەڵام گرنگ ئەوەیە کۆدی گرنگ و سەرنجراکێشت دەست بکەوێت لەناو سیدی ئەم کتێبەدا چەند کۆدێکی html و java و هی ترمان ئامادەکردووە و دەتوانن سوودی لێوەربگرن .

## ڕێگەکانی دانانی code بۆماڵپەڕ:

1- سەرەتا ئەوکۆدەی هەتە سەلێکت و پاشان کۆپی copy بکە
.

2- ئینجا بەرنامەی Front page بکەرەوە و لەوێدا پەیجێکی نوێ بکەرەوە.یان لەناوشوێنێکی پەیجی سایتەکەت دایبنێ..

3- لەوپەیجە تازەیەدا بچۆرەسەر html لەشوێنی پیشاندان ,کەبە 3 شێوە ساتەکەت پیشان دەدات , پاشان لەدوای HTML ی یەکەم یان کۆتایی واتە لەبەینیدا کۆدەکەت پەیست بکە PASTE .




4- ئینجا کلیکی PREVIEW بکە بۆبینینی کاری کۆدەکەت .

تێبینی :بۆئەوەی نووسینی کۆدەکان بگۆڕیت بۆ ناوێکی تر بچۆ لەناو ئەوکۆدەی هێناوتە ناوەکەی پێشوو بدۆزەرەوە واتە ئەو کۆدەت لەئەسڵدا بەچ ناوێکە بیدۆزەوەو بیکە بەناوێکی تر .

- بۆئاگاداریتان لەم ماوەیەدا کتێبێکتان بەناوی html پێشکەش دەکەین..

## تێبینی :

ئەگەر شارەزاییەکی باشت لەکارکردن بەکۆدەکانی html یان java هەبێت دەتوانیت نەک تەنها کۆد بۆسایتەکەت دابنێیت ،بەڵکو بەهۆی کۆدەکانەوە لەلیستی html لەناوبەرنامەی فرۆنتپەیج یان بەرنامەی تردا سایت دروست بکەیت ،بەمەش سایزیسایتەکەت زۆرکەم دەبێت وبۆئاپلۆد کردن ئاسان دەبێت ،لێرەدا چەند تێبینییەک هەیەلەسەر script پێویستە بیزانن:

دووجۆری سەرەکی script هەیە

1- Java script

2- VB script

هەریەکێک لەوانەدەتوانین CODE کانیان دەرەکی بن واتە لەناوفایلدابن وپاشان تەنها لینکێک یان بۆبکەین ،شێوەی دووەم پێی دەوترێت inline script ،کەدەبێت لەناو BODY دا دابنرێت ،بەڵام شێوەی یەکەم پێویستە لەناو HEAD دا دابنرێن...

* کاتێک تۆپەیوەند نیت بەئینتەرنێتەوەو دەتەوێت بەهۆی فەرمانی Hover button دووگمە بۆسایتەکەت دروست بکەیت ،کەلەناو insert>component بۆی دە چیت ،بەڵام دوای دروستکردنی دووگمەکە لەپریڤیودا دەرناکەوێت ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کۆدی ناو castle کانی ناو جاڤالەوێدا بوونی هەیەو دەبێت پەیوەند بیت بەئینتەرنێتەوەئینجا ئەو دووگمەیە پریڤیو دەکات.

## بەشی پێنجەم

## بۆ پێدانی reflet بەرنامەی شەپۆل بەوێنەکانمان

**بەرنامەی reflet بۆ پێدانی شەپۆل بەوێنەکانمان**

بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە زۆر ئاسانە , لەماوەیەکی زەمەنی کەمدا شەپۆلێکی جوان ئیزافە دەکاتە سەروێنەکەت بەهەڵگێڕاوەیی , زۆرکەس لەوانەی سایت دروست دەکەن سوود لەم بەرنامەیە وەردەگرن , بۆئەوەی شەپۆلێکی جولاو بدەیت بەوێنەکانت سەرنجی ئەم نموونەیە بدە:

1- سەرەتا بەرنامەکە بکەرەوە ( لەناوسیدیەکەدا ئەم بەرنامەیە هەیە ).




2- کلیکی open بکە واتە لیستە زەردەکەیەکسەر ئەم پەنجەرەی خوارەوە دەکرێتەوە ئینجا بچۆ وێنەیەك ودەبڵکلیك بکە:




3- ئینجا وێنەکە دێتە ناوبەرنامەکەوە تۆلەوکاتەدا کلیك لەسەرنیشانەی دوو دەستەکە بکە یتاوەکو شەپۆل بدات بەوێنەکەت ....ئینجا بۆسەیڤکردنی لەشوێنێکدا بۆکسێکی بچووک دێت لەلیستی format d export فۆرماتی وێنەکە دیاری بکە , کەبەچ جۆرێك دەتەوێت سەیڤی بکەیت واچاکە jpg دیاری بکەیت , چونکە شوێن کەم دەگرێت . لەخوارەوەش , کەنو وسراوە coulerurs هەڵبژاردنی 256 دیاری بکەو ok بکە .




4- ئینجا بۆکسێك دێت تۆلەوێدا ئەو وێنەیەی شەپۆلت داوەتیَ بەناوێکەوە خەزنی بکە وکلیك لەسەر save بکە .




4- ئینجا بۆکسێك دێت تۆلەوێدا non دیاری بکە




ئیتر پاشان بچۆ لەکوێ وێنەکەت سەیڤکردووە لەناو ماڵپەڕەکەت دایبنێ .

## بەشی شەشەم

# دانانی چەند شتێکی گرنگ بۆناو سایتەکەت

# دانانی چەند شتێکی گرنگ بۆناو سایتەکەت

**چۆنیەتی ئیزافەکردنی گۆرانی و فیلم بۆ ناو سایتەکەت**

**ئیزافەکردنی گۆرانی و دەنگ :**

**کاتێك تۆ سایتێك بۆخۆت لەناو کۆمپانیا بەخۆڕاییەکان دادەنێیت ,ئەوا ماوەیەکی دیاریکراوت دەداتێ تاوەکو ماڵپەڕەکەتی تیادابنێیت و دیاریکراوە بۆنموونە سایتی فری سێرڤەر 12 میگابایتت دەداتێ ' بۆیە ناتوانیت گۆرانی زۆردابنێیت ,چونکە لەکاتی ئاپلۆدکردندا بەئاسانی ناچێتە ناو ئەو شوێنەی بەشداریت تیاکردووە ,**

## بۆ دانانی گۆرانی لەسایتەکەتدا لەناو بەرنامەی فرۆنت پەیجدا ئەم هەنگاوانە بگرەبەر :

**@ئەگەر ویستت راستەوخۆ هەرکەس سایتەکەتی کردەوە مۆسیقا یان گۆرانییەك بێت ئەم کارانە بکە:**

**1- ئەو شوێنە دیاری بکەو بیکەرەوە , کەدەتەوێت مەلەفی دەنگی بۆ ئیزافە بکەیت واتە لینکەکە.**

2- لەلیستی File دا فەرمانی properties هەڵبژێرە ، بۆئەوەی بۆکسی page properiets بکرێتەوە.سەیری وێنەکە بکە:




3- لەبەشی Background sound و لەچوارگۆشەی نووسینlocation ناوی مەلەفە دەنگیەکەت بنووسە ئینجا بچۆرە سەردووگمەی browse بەکاربێنە ئەگەر هاتوو نەتزانی لەکوێی گۆرانیەکەت سەیڤ کردووە بەمەبەستی دۆزینەوەی فایلەکەی.

4- لەبەشی Loop دا دەتەوێت چەند جار مەلەفەدەنگیەکە واتە گۆرانیەکە کاربکات دیاری بکە دەتوانیت خانەی forever دیاری بکەیت .دواجار کلیك لەسەر ئۆکەی بکە .

@ ئەگەر ویستت گۆرانیەکان لەناو لینکێکدا LINKS دا دابنێیت و بەکلیك کردن لەسەر لینکەکە گۆرانییەکە کاربکات ئەوا ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکە:

1- سەرەتا لینکەکە سەلێکت بکە وکلیکی راستی لەسەر بکە :




ئینجا لەخوارەوە بچۆ Hyperlink هەڵبژێرە .

2- دەبینیت بۆکسێك دەکرێتەوە بۆت بەمجۆرەی خوارەوە :



ئەو گۆرانییەت لەچ درایڤێكدا داناوە بیدۆزەرەوەو یەك كلیكی لەسەر بكە با ببێت بەلینك , سەیرێكی خانەی ADDRESS بكە لەخوارەوە ناوی فایلی گۆرانییەكەی تیانووسراوە ,ئینجا ئۆكەی بكە یەكسەر گۆرانییەكە لینك دەبێت ئێستا بچۆ لەرێی preview سەیری بكە و كلیك لەسەر ئەولینكە بكە یەكسەر گۆرانییەكەت بۆدەكرێتەوە , چ بەرنامەیەكی دەنگیت دابەزاندبێت بەوە دەكرێتەوە وەكو بەرنامەكانی ریەڵ پلایەرو میدیا پلەیەر .بۆئەوەی لەناو لینكێكدا چەند گۆرانییەك لینك بكەیت زۆرئاسانە بچۆ دوای لینك كردنی دووگمەی یەكەم لەناو ئەو دووگمە لینك كراوەدا بەژمارە ناوی گۆرانییەكان دابنێو هەریەكەیان بەجیا لینك بكە , هەمان كردارەكانی پێشوو دووبارەدەكەیتەوە.

## بۆ ئیزافەكردنی گرتەی ڤیدیۆیی بۆناو سایتەكەت :

2- كلیكی ئەو شوێنە بكە , كەدەتەوێت لەقتە ڤیدیۆییەكەی تیادەربكەوێت .

لەلیستی insert–2 دابەشی picture و لەوێشدا video




یەكسەر ئەم دیالۆگ بۆكسەت بۆدەردەكەوێت :




3- ئینجا دەست بكە بەدیاریكردنی شوێنی مەلەفەكەودەبێت لەناو ئەوفۆڵدەرە داتنابێت ,كەهەموو فایلەكانت تیا خەزن كردووە بۆنموونە لێرە لەناو فۆڵدەری kurd كەفوڵدەری سەرەكی پەیجەكەمانەفایلی ڤیدیۆیی osmnara كلیك بكە .

4- ئینجا كلیكی دووگمەی open بۆدابەزینی مەلەفە ڤیدیۆییەكە.

# هەڵبژاردنەکانی پیشاندانی لەقتەی ڤیدیۆیی

1– کلیکی لای ڕاست لەسەر ئەو مەلەفە ڤیدیۆییە بکە,کەلەناو یەکێك لەپەیجەکانی سایتەکەت داتبەزاندووە :ئینجا بچۆ picture properties هەڵبژێرە و

و ئەم بۆکسەت بۆدەردەکەوێت بەناوی picture properties:




– ئینجا لەناوئەم بۆکسەدا video هەڵبژێرە:




–ئەو هەڵبژاردنانەی دەتەوێت دیاری بکە و ئینجا کلیك لەسەرokبکە

,بۆزانیاری زیاتر هەڵبژاردنەکان ئەمانەن , کەپێویستەبیزانیت

Start on file open : لەگەڵ داتبەزاند لەقتەکە ئیش دەکات

Start on mouse over هەرکەنیشانەی ماوسەکەت خستە سەر لەقتەکە ئیش دەکات.

# دابەزاندنی وێنە بۆناو سایتەکەت

دانانی وێنە بۆماڵپەڕی سایت کارێکی گرنگەو جوانکاری دەبەخشێت بەسایت بەڵام home page ی سایت نابێت بەوێنەی زۆر بئاخنرێت چونکە لینك و ئیفێکت و زۆربەشی تری سایتەکەت دەکوژێت ...



**بۆهێنانی وێنە ئەم هەنگاوانە بگرەبەر:**

**1-بچۆرە سەر ئەم رەمزە یاخود بچۆرە سەر**

insrt> picture>from file




2- پاش ئەوەی وێنەکەت لەناو بۆکسەکەدا دۆزییەوەو سەلێکتت کرد ئینجا کلیکی insert بکە بۆئەوە وێنەکە دابەزێتە ناو سایتەکەت و دەستکاری بکەیت و لەوجێگەیەی دەتەوێت دایبنێیت :




@ دەبێت ئەو وێنەیەی دەیهێنیت لەناو ئەو فوڵدەرە وەریبگریت , کەهەموو فایل و وێنەو دووگمەی سایتەکەت تیا داناوە .

@ تائەتوانیت وێنەکانت بەبچووکی دابنێ بۆئەوەی لەکاتی ئاپلۆد کردندا قورس نەبێت .

**@ دەتوانیت بەهۆی شریتی picture ەوە تەحەکومی تەواو بەوێنەکەت بکەیت بەئارەزووی خۆت لەکوێت بوێ دایبنێیت و چوار چێوەو جوانکاری و هەڵگەڕاوەی بکەیت ....سەرنجی ئەمەی خوارەوە بدە:**

**–بۆدەرخستنی شریتی picture بچۆ کلیکی لای راست لەسەر شریتی ئامرازەکان بکە و لەولیستەدا picture کلیک بکە.**

# لایەنە گرنگەکانی بەکارهێنانی ئامرازی pictures







تێبینی: وێنەکە کلیك بکە تاوەکو ئەو تولە ئەکتیڤ بێت..



بەشی حەوتەم
acrobat کردنی پەیجەکان بە ئەکرۆبات




ures
بەهۆی ئەم ڕەمزانەوە تەحەکوم بەوێنەکەتەوە دەکەیت وە چیتر نالکێت بەلینکەکانی ترەوەو دەتوانیت بەئارەزوی خۆت لەکوێت بوێت دایبنێیت
ئەم چوار ڕەمزە کاریان هەڵگێڕانەوەی وێنەکانە
بۆئەوەی بتوانیت لەسەر وێنەکە شت بنووسیت ,لەگەڵ هەڵتبژارد بۆکسێك دێت ولەوێدا نوسین بنووسە

1– سەرەتا بچۆ ئەونووسینەی لەناوبەرنامەی word وۆرد هەتە بیکەرەوە .

کەنووسینەکەت هێنا کلیك لەسەر print بکە,




لەوێشدا

5Dpdf creater هەڵبژێرە . ئینجا OK بکە یەکسەر بۆکسێك دێتە بەردەمت .




2– لەناوبۆکسەکەدا ئەمانە بکە :




پاش کەمێك چاوەڕوانی ئەو بابەتەت دەبێت بە PDF و بەبەرنامەی ئەکرۆبات ریدەر دەکرێتەوە .

یان راستەوخۆ بەرنامەی PDF CREATER بکەرەوە ئینجا بچۆرە سەر FILE و ئەو بابەتەی دەتەوێت بیکەیت بەPDFبهێنە لەناو هەردرایڤێکدایە ئینجا دەبڵ کلیکی لەسەر بکە و بۆکسێك دێت YES دیاری بکەو چاوەڕێ پاش کەمێك دەبێتەPDF .

–تێبینی : دەتوانیت لەرێگەی بەرنامەی adobe distiller هەمان کرداری کردنی پەیجەکان بە pdf ئەنجام بدەیت .

# کورتکردنەوەی ناونیشانی سایتەکەت

سایتێکی تایبەت هەیە کاری ئەوەیە ناونیشانی سایتە بەخۆڕاییە درێژەکان کورت دەکاتەوە , ئەمەش کاتێك دەبێت , کەچەند هەنگاوێك هەیە بیگریتەبەر , بۆنموونە ناونیشانی سایتەکەت بەمجۆرەیە www.saman.itgo.com .... ناونیشانی سایتەکەت دەگۆڕێت بۆ www.saman.tk , بەمەش شەخسیاتێك دەداتە سایتەکەت و خەڵکی وادەزانن دۆمەین نەیمت کڕیوە .

ئەگەر دەتەوێت ناونیشانی سایتەکەی خۆت کورت بکەیتەوە ئەم هەنگاوانە بەوردی بگرەبەر :

*سەرەتا سایتی www.dot.tk دەکەینەوە .

*پەیجێك دێتە بەردەممان لەولاکێشەیەدا ناوی سایتەکەت




## بەشی هەشتەم

## چۆنییەتی کورتکردنەوەی ناونیشانی سایتەکەت

*بنووسه , بۆنموونه بنووسه www.a7lanet. ئینجا ok بکه .
*پەیجێکی تر دێته بەردەمت هەڵبژاردنی یەکەم , کەنووسراوه free domain name دیاری دەکەین پاشان لەوشوێنەی پرسیاری وڵاتەکەت لێدەکات بەمجۆره where do u live لەوێدا ناوی وڵاتەکەت هەڵبژێره و کلیك لەسەر continue بکه.

Type of registration
Please select your registration
FREE DOMAIN NAM
دڵنیابە لەدیاری کردنی ئەمە
Dot TK paid registration
Where do you live?
Please s
U.S.A.
ناوی وڵاتەکەت هەڵبژێره
دواتر کلیکی ئێره بکه
CONTINUE >>

بۆئەوەی بزانێت ئایا ئەو ناوه حیجزکراوه یان نا , پاشان پەیجێکی تر دەکرێتەوه و تیایدا لەوه ئاگادارت دەکاتەوه , کەئایا ناوەکه حیجزکراوه یان نا , ئەگەرهاتوو ناوەکه حیجزکرابوو ئەوا داوای ناوێکی ترت لێدەکات , ئەگەر ناوەکه حیجز نەکرابوو ئەوا بەرەنگی سەوز ئەمەت بۆدەنووسیت :

your domain name :
your name.tk

واته ناوی سایتەکەت لەخوارەوەی yourname لێرەدا ئەوەبزانه چوارگۆشەیەکی بەتاڵ دەبینیت تۆلەوێدا ناوی سایتەکەت بنووسه کەدەتەوێتناونیشانەکەی کورت بکەیتەوه, ئینجا لەلیستی what is your website or hompage about? سایتەکەت چ جۆره سایتێکه دیاری بکه . لەخوارئەویشەوه زمانەکەت دیاری بکه .دواجار لەوێدا کلیك لەسەر continue بکه.

Website description
لێرەدا وەسفێك سایتەکەت بنووسه
What is your website or homepage about?
Please select the category that fits your website
Computers and technology
بواری سایتەکەت هەڵبژێره
In what language is your website?
Please select the language of your website
Arabic
زمان دیاری بکه

*پاشان پەیجێکی تردەکرێتەوە چەند لاکێشەیەکی بەتاڵی تێدایە بەکاردێت بۆگەڕان بەدوای سایتەکەتدا ,بۆنموونە ئەگەرسایتەکەت بەرنامەی تیابوو ئەوا لەوخانانەدا بەرنامە بنووسە ,تەنها 1خانە پربکەرەوەبەسە ,لەخوار خانەکاندا چوارگۆشەی تر هەیە بەئارەزووی خۆت یەکێکیان دیاری بکەو نیشانەی راستی لەبەردەمدا دابنێ ,ئەو وشەیەی لەخوارەوە بەگەورەیی نووسراوە لەخانەکەدا وەکو خۆی بینووسەرەوە.ئینجا continue بکە .

At least one keyword should be filled out.

games | programme
fonts | sounds

ئەوەی لەناوسایتەکەت هەیە بینووسە وەکوو یاری – بەرنامە – فۆنت.........

**A closer look at your website**

Please specify as detailed as possible what kind of information ca
be found on your website. Please use as many options from this

یەکێکیان دیاری بکە

- E-zine
- Daily news
- Professional journal
- Online sales
- Online trade
- Downloadsite
- Online support

ئەمو وشەیەی بەگەورەیی نوسراوە لەناوخانەکەی سەرەوە وەکو خۆی بینووسەرەوە

This word is: chythia

Chythia

کلیکی ئێرە بکە

CONTINUE >>

*پاشان پەیجێکی تردێت لەوێدا زانیاری شەخسی داغڵ بکە بەمجۆرە:

Not all fields are filled out

Your name — ناوی یەکەمت بنووسە بۆنموونە sarwar

Your address — ناونیشانەکەت بنووسە بۆنموونە Kurdistan

Your zipcode — کۆدی عیراق بنووسە 964

Your city — ناوی شارەکەت بنووسە بۆنموونە sul

Your state

Your country — وڵاتەکەت دیاری بکە

Your phone number
Country code - Area code Number
کۆدی تەلەفۆن دانێ
non یان بنووسە 0044
ژمارەی تەلەفۆن

Your fax number
Country code - Area code Number
فاکس ئیختیارییە
دەتوانیت داینەنێیت

Your gender: Male
ڕەگەز دیاری بکە
Your age group: 18-25
تەمەن دیاری بکە
Your occupation: Student
ئاستی خوێندەواری

Your password needs to be at least 5 and maximum of 8 characters.

Your email address: THEGREENEYES1@YAHOO.COM
ناونیشانی ئیمەیڵەکەت
Your password: *******
پاسۆردەکەت
Retype password: *******
دووبارەپاسۆردەکەت بنووسەرەوە

☑ Keep me informed about Dot TK, Dot TK affiliates and

ئەگەر دەتەوێت هەواڵت لەرێی ئیمەیڵەوە پێی
بگات ئەو نیشانەیە دابنێ

دواجار کلێکی ئێرە بکە

CONTINUE >>

*دواجار پەیجێك دێت تیایدا لەوە ئاگادارت دەكات , كەئیمێڵێك گەیشتۆتە ئیمەیڵەكەت, واتە پەڕەكە گرنگ نییە بەڵكو ئەوە گرنگە هەموو هەنگاوەكانت راستە... ئینجا بچۆ ئیمەیڵەكەت بكەرەوە .. بەمجۆرە نامە دەبینیت :

:dot tk registration center
: please confirm your free registration

وەكو لەوێنەكەدا دیارە :

☐ Dot TK registration center    Please confirm your free registration

*دوای كردنەوەی ئیمەیڵەكەت لەناویدا كۆدی چالاك كردن و لینكێ دەبینیت دەست بكە بەكۆپیكردنی كۆدەكەو كلیك لەسەر لینكەكە بكە ...

```
confirmation code: TK712953
(please note: this is not your pass

As you know we like t                          so all you need
to do to activate you

1. Go to http://my.dot.tk/cgi-bin/confirm.taloha?tk=1184201

2. And enter your confirmation code

If you have received this email, but did not join us @ Dot TK,
then somebody tried to register using your e-mail address.

You can simply ignore this message... But why not come on in,
and see for yourself if your own -free- domain name is still
available at http://www.dot.tk
```

كۆدی چالاك كردن

كلیكی ئێرە بكە

*گەیشتینە دواهەنگاوی تۆماربوون ,دوای کلیك کردن لە لینکەکە پەیجێکمان بۆدەکرێتەوە , کەلاکێشەیەکی گەورەی تێدایەو دەست بکە بە paste پەیست کردنی کۆدەکە لەناوئەو لاکێشەیەدا , ئینجا کلیکی ئەمە بکە confirm registration بکە , کەلەخوارەوەیە . دواجار دواپەیج دەکرێتەوە داوای ئەوت لێدەکات کەمێك چاوەڕێی بکەیت بۆئەوەی کورتەی ناونیشانی سایتەکەت ئامادەبکات .

**Domain name registration (Confirmation page 1 of 2)**

Malo ni!

In order to complete your Dot TK registration, you have to enter your confirmation code on this webpage.

If the registration does not work, please wait at least 30 minutes and try again to signup at http://www.dot.tk.

کۆدەکە لێرە

Confirmation code TK712953

Confirm registration

کلیکی ئێرە بکە

تێبینی : پاش تەواوبوون لەو کردارانە 5دەقیقە چاوەڕوان بە وئینجا بەو ناونیشانە کورتە سایتەکەت تاقی بکەرەوە .

## بەشی نۆیەم

## چۆن پەیجەکانت دەکەیت بە پەیجی ئینتەرنێت web page ؟

# چۆن پەیجەكانت دەكەیت بە پەیجی ئینتەرنێت web page ؟

یەكێك لەئامادەكارییەكانی دروستكردنی سایت , كەزۆرگرنگە ئەوەیە ئەو پەڕانەی دەتەوێت داخڵی ماڵپەڕەكەتی بكەیت بكەیتە شێوەیەك , كەلەگەڵ ئینتەرنێت ڕێك بكەوێت و بیخوێنێتەوە , واتە پەیجەكان پێویستە بكرێنە سەرشێوەی زمانی htmlمەگەر هەندێك مەلەف نەبێت, كە هی بەرنامەی word بن .

## چۆنییەتی كردنی پەیجەكان بە پەیجی ئینتەرنێت

* لەناو بەرنامەی word بابەتەكەت بنووسە , پاشان بچۆرە سەرمینۆی File ئینجا بۆ save as و لەوێدا بچۆ لەرێی خانەی save as type هەڵبژاردنی web page دیاری بكەو دواجار كلیكی save بكە.




@ بەڵام ئەگەر هاتوو ئۆفیسەكەت 2003 بوو ئەوا ئەم هەنگاوانە بگرە بەر :

لەناو بەرنامەی word دا بابەتەكەت بنووسەو ئینجا هەرلەوپەیجەدا بچۆرە سەر save as web page و لەوێدا web page دیاری بكەوبەناوێكی ناسراوەوە سەیڤی بكە.




## دروستكردنی پەیجی ئینتەرنێت لەناو بەرنامەی FRONT PAGE 2002

@ دەتوانیت هەرلەناو بەرنامەی FRONT PAGE دا لەناو پەیجێكی تازەدا شت بنووسیت و دوای تەواوبوون لەنووسینەكەت بچۆرە سەر FILE و دواتر SAVE AS هەڵبژێرە لەوێشدا لەلیستی FILE NAME




دا ناوێکی لێبنێ ئینجا لەخوارەوە , کەنووسراوە SAVE AS
TYPE ئەمە دیاری بکە WEB PAGES.

**تێبینی زۆرگرنگ :**

1- دەبێت ئەو بابەتانەی دەیانکەیتە سەرشێوەی WEB PAGE
بە ناوێکی ئینگلیزی سەیڤیان بکەیت.

2- هەموویان لەناو یەک فۆلدەر لەناو MYWEB دابنێیت .

@ بەوهیوایەی بەم کتێبە هەمووتان ببنە خاوەن سایتی تایبەت بەخۆتان و لەئایندەدا بەبەردەوامی چ وەک کتێب یان لەناو گۆڤاری وێب یان بەسیدی زانیاری ترتان لەبارەی دیزاینی سایت پێشکەش دەکەین.

براتان

سەرکەوت پێنجوێنی

## کتێبە چاپکراوەکانی سەرکەوت پێنجوێنی

1- فێربوونی ئینتەرنێت 2001
2- تێگەیشتن لەئینتەرنێت 2002
3- ئینسایکلۆپیدیای ئینتەرنێت 2002
4- گەڕان لەئینتەرنێتدا 2003
5- کلیلی ئینتەرنێت 2003
6- ڕێبەری مۆبایل 2004
7- کەتەلۆگی سایتەکان 2004
8- دروستکردنی سایت 2004

@ بۆزانیاری زیاتر پەیوەندی بکە بە :
07702220060
kicoweb@yahoo.com

sarkawt@paris.com